

# وەڵامی گومانەکان لەسەر ئیمامی أبو حەنیفە

نوسینی: دابان تەوحیدی

ئامادەکردنی
هومام کوردی



# پێشـەکی

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله حمدًا يليق بجلال وجهه وعظيم سلطانه ، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له ، وأشهد أن محمدًا عبد الله ورسوله ، صلوات الله وسلامه عليه وعلى آله وأصحابه ، ومَن سار على نهجه إلى يوم الدين .

لەگەڵ ئەوەی کە هیچ کەسێک بە مەعصوم و پارێزراو نازانین لە کەوتنیان بۆ ناو هەڵەوە جگە لە پێغەمبەران نەبێت ( عليهم الصلاة والسلام ) بەڵام شایەنی باسە کە هەندێک برا بە ئاگا بهێنینەوە لەوەی کە تەکفیری بە ناحەق بکەن ، بۆیە یەکێک لەو کەسانەی کە زۆرترین قسەی لەسەر کراوە بەناڕاست : ئیمامی أبو حەنیفەیە ، لەکاتێکدا زۆربەی ئەو ڕیوایەتانەی دەربارەی وتراون لاوازە ، بەڵکو جەندین ڕیوایەتی تر بە پێچەوانەی ئەو ڕیوایەتە زەعیفە هاتووە صەحیحە ، لەگەڵ ئەمەشدا چەندین زانای گەورە لە سەردەمی ئەودا تەکفیری أبو حەنیفەیان نەکردووە ، لەوانیش ئیمامی شافعی و ئیمامی أحمد و وەکیع و عبداللەی کوڕی موبارەک ئیمامی مالک جگە لەوانیش ، ئایا دەگونجێت و دەچێتە عەقڵەوە کەسێک خاوەنی دەیان کوفر بێت کەچی ئەم گەورە زانایانەی سەردەمی خۆی تەکفیری نەکەن بەڵام دوای چەندین ساڵ لە وەفاتی ئینجا ڕیوایەت لە دژیدا کۆبکرێتەوە ، بۆیە پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) پارێزراو نەبووە لەوەی کە فەرموودەی بە درۆ بەدەم ئەو نەگێڕنەوە چجای

بگات بە کەسانی خوار ئەوەوە ، جا وەڵامی زۆر گومانمان لەژێر دەستدا بوو بەڵام لەبەر نەبوونی کات تەنها حەوت شوبهەی گرنگمان لێی هەڵبژارد و وەڵاممان داوەتەوە ، بۆیەش وەڵام دانەوەی ئەم گومانانەمان بە گرنگ زانی چونکە هەرگیز ئەم ئوممەتە لەسەر گومڕایی کۆنابێتەوە ، ئایا دەگونجێت ئەو هەمووە گەورە زانایانەی ئەهلی سوننە لەدوای خۆی تەکفیری أبو حەنیفەیان نەکردووە بەڵام تۆ پێت وابێت کەوا لەسەر صەوابی و ئەم ئوممەتە چەندین سەدەی لەسەر هەڵە بووینە چونکە تەکفیری أبو حەنیفەیان نەکردووە ! ، جا کۆتا شتیش کە لەم پێشەکیە دەمەوێت باسی بکەم ئەوەیە کە ئەگەر ویستت حاڵی زانایەک یان کەسێک بزانی بڕۆ سەیری کتێبەکانی خۆی بکە نەوەک ئەو قسانەی لەسەری دەوترێت !.

الله سبحانه وتعالى ئیصلاحی حاڵی هەموو لایەکمان بکات و لەسەر إخلاص و صەواب بژین و بمرین ، آمین .

# أبـو حەنیـفە کێـیـە ؟

ناوی تەواوی : أبو حەنیفەی نعمان ی کوڕی ثابت ی کوڕی مرزُبان ی کوفی یە . ( 80 - 150 هـ / 699 - 767 م ) ( ڕەحمەتی الله تعالی لێی بێت و لێی خۆش بێت ) فەقیهـ و زانایەکی موسڵمانە ، وە یەکەمین زانای نێوان چوار زاناکەیە لەلای ئەهلی سوننە و جەماعەت ، وە خاوەنی مەزهەبی حەنەفیە لە فیقهی ئیسلامی ، وە بە عیلمێکی زۆر و ڕەوشتی جوان بەناو بانگ بووە ، پێش زانایانی جەرح و تەعدیل هاتووە بە ماوەیەک ، جا یەکەم کتێبی فەرموودە کە دانرا بەناوی ( الموطأ ) کە لەدوای أبو حەنیفەوە هات ، وە أبو حەنیفە ڕیوایەتی فەرموودەی زۆر نەکردووە لەبەر بڵاوبوونەوەی درۆ و بوهتان لەنێوان خەڵکی عێراقدا ، وە هاوڕێکەی أبو یوسف ئاماژەی بەمە کردووە کاتێک بەدوای فەرموودەدا گەڕا ، جا لێیەوە ڕیوایەت کراوە کەوا فەرموویەتی :

( لو علم صاحبي ما أعلم لقال في كذا وكذا غير ما قال , فبضاعته في الحديث كانت قليلة مقارنة بمن جاء بعده وهذا سبب بعض أخطائه ) .

لەبەرئەمە زۆرێک لە ڕاو بۆچوونە فقهیەکانیدا ڕەئی بەکارهێناوە ، جا ئەمە لەلای أبو حەنیفەدا پێی دەوت : ( الرأي ) بەڵام ئەمە هەمان ئەو شتەیە کە لەلای ئەوانەی لەدوای ئەودا هاتوون پێیان دەوت : ( قیاس ) ، جا مەبەستی لە ڕەئی بریتی نەبوو لە دەربڕینی ڕاو بۆچوون بە هەواو ئارەزووی بەڵکو ئەم ڕەئیە بیناکراوە لەسەر دەلیل یان قرائن یان متابەعەی ئوصولێکی گشتی لە شەریعەتدا ، جا سەلەف بە إجتهادیان

٭٭... وەڵامی گومانەکان لەسەر ئیمامی أبو حەنیفە............................٭٭

دەوت ڕەئی لە مەسائیلێکی کێشە لەسەربوو ، هەروەکو چۆن زۆرێکیان دەربارەی تەفسیرێک لە ئایەتەکانی کتێبی الله تعالی ـدا دەیانفەرموو : أقول فيها برأيي ، واتە : بە إجتهادی خۆم ، جا هەرگیز مەبەستیش لە دەربڕینی ڕاو بۆچوونیان نەبوو لە هەواو ئارەزووی خۆیاندا .

هەروەها ئیمامی أبو حەنیفە فەرموویەتی : " حەڵاڵ نییە بۆ هیچ کەسێک کەوا دەستبگرێت بە قسەیەکی ئێمە ئەگەر نەزانێت لە کوێوە وەرمانگرتووە " ، وە هەروەها لێیەوە ڕیوایەت کراوە : " حەڕامە لەسەر کەسێک کە دەلیلەکەم نەزانێت ( لەکوێوە هێناومە ) وە فەتوا بدات بە قسەکانم " وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە : " بێگومان ئێمەش مرۆڤین ، ئەمڕۆکە قسەیەک دەکەین و بەیانیش لێی پەشیمان دەبینەوە .

وە فەرموویەتی : " هەرکات قسەیەکم کرد کەوا پێچەوانەی کتاب الله تعالی و خەبەری پێغەمبەر بوو ( صلى الله عليه وسلم ) ئەوە واز لەو قسەیەی من بهێنن " .

بەڵام بە نسبەت درانە پاڵی ئەوەی کە قورئان مەخلوقە ئەوا زۆر ڕوونە کە جەهمیەکان و موعتەزیلەکان ئەمەیان داوەتە پاڵی بە درۆ تاوەکو ڕاو بۆچوونەکەی خۆیان سەربخەن ، وە هەروەها زۆربەی هەرە زۆریشی زەعیفە .

**... وەڵامی گومانەکان لەسەر ئیمامی أبو حەنیفە..............................**

هەندێک کەس وا تێگەیشتوون لە قسەی زانایانی جەرح و تەعدیل ـدا کە : ( أبو حەنیفە لە لاوازەکانە و تەرکی حەدیثەکانی دەکرێت ) لەسەر ئەوەی کەوا قسەیان کردووە دەربارەی دینی مرۆڤ یان حوکم دان بەسەریدا بە کوفر .

وە بەڕاستی ئیمامی بوخاری ( ڕەحمەتی الله لێی بێت ) خۆی پاراستووە لە دەربڕینی ئەو ووشە ڕەقانەی کە هەندێک کەسیتر بەکاری دەهێنن لە [ الجرح و التعدیل ـدا ] لەترسی ئەوەی نەوەک ببێتە غەیبەتی مرۆڤێکی موسڵمان ئینجا زیاتر ئەم ووتەیەی بەکار هێناوە " فیە نظر "

جا کاتێک إختلافت هەیە لەگەڵ أبو حەنیفە و کەسانی تر ئەوا لەو ووتانە بۆت ڕوون دەبێتەوە کە چەندە پێچەوانەی بەڵگە صحیحەکانن ، بەڵام کە تەکفیری بکەیت وە حوکمی کوفری لەسەر بدەیت ئەوا هەڵخلیسکان و مەترسیدارە .

چونکە بەشێک لە زاناکان لێردا وەسفی دەکەن وەک :[وەکیع ، وە شافعی ، وە عبداللهی کوڕی موبارەک ، جگە لەوانیش ...هتد ]

لە وەسفی زاناکان بۆی :

٭٭... وەڵامی گومانەکان لەسەر ئیمامی أبو حەنیفە..............................٭٭

وکیعی کوڕی الجراح کە شێخی ئیمام شافعیە دەفەرموێت : ( بەڕاستی أبو حەنیفە ئەمانەت پارێزێکی گەورە ، وە کاریگەریەکەی تەنها بۆ ڕەزامەندی اللّٰەیە ، وە ئەگەر شمشێرەکەی گرتبا ئەوا لەبەر الله هەڵیدەگرت ).

وە ئیمام شافعی دەفەرموێت : پرسیار لە مالک ی کوڕی ئەنەس کرا : ئایا ابو حەنیفەت بینیووە و تەماشات کردبێت ؟، ئەویش فەرمووی : ( بەڵێ ، پیاوێکم بینی ئەگەر سەیری ئەو ستوونەت بکردبا کە لە بەردە ، بەڵام ئەو وەک زێڕە لەبەر بەڵگەکانیەوە .

وە هەروەها ئیمامی شافعی دەفەرموێت :

( هەرکەسێک فەرموودەی صحیحی ویست با لای مالک بێت ، وە هەرکەسێک گفتووگۆی ویست با لای أبو حەنیفە بێت ، وە هەرکەسێک تەفسیری وویست با لای مقاتل ی کوڕی سلیمان بێت ) وە هەروەها فەرموویەتی : هەرکەسێک وویستی بە قوڵی لە فقە بکۆڵێتەوە ئەوە لەچاو ابو حەنیفە منداڵە ، وە أبو حەنیفە یەکێک بوو لەو کەسانەی ڕایەکانی بە پێی فقە بوو .

وە ئیمامی احمدی کوڕی حەنبەل دەفەرموێت : بەڕاستی ابو حنیفە لە علم و دینداری و وەرع و وازهێنان لەدونیا و هەوڵدان بۆ ئاخیرەت لە هیچ کەسێکی تر هاوشێوەی ئەو هەستم پێنەکردووە ، جا الله ڕەحمی پێبکات و لێی ڕازی بێت ).

هەروەها ئیمام احمد زۆر باسی دەکرد و ڕەحمەتی بۆ دەنارد ، وە لە سەردەمی تاقیکردنەوەکەیدا بۆی دەگریا .

وە عبداللە کوڕی موبارەک دەفەرمویێت : ( باشترین بەندە و عابدترین کەسم بینی ، وە باشترین کەسم بینی لە وەرع و تەقوادا ، وە زاناترین کەسم بینی ، وە تێگەشتووترین و فەقیهترین کەسم بینی ، جا باشترین بەندە [ عبد العزیز بن ابي رواد ]ـە ، وە دیندارترین کەس [ الفضیل بن عیاض ]، وە زاناترین کەس [ سفیان الثوري ]ـە، وە تێگەشتووترین کەس [ ابو حەنیفە ]ـە، پاشان فەرمووی 《کەسم وەک ئەو شارەزا نەبینیووە لە فقهـ ـدا》

وە محمدی کورڕی احمدی کوڕی یەعقوب ئەڵێت: باپیرم هەواڵی پێدام ووتی : (بەشێک لە هاوەڵەکانمان کۆمەڵێک بەیتیان دانا کە [ عبداللە بن المبارک ] وەسفی ابو حەنفیە دەکات .

## وەڵامی گومانەکان لەبارەی ئیمامی أبو حنیفە ( رحمه الله وغفر له )

بسم الله الرحمن الرحیم

الحمدلله وحده ، والصلاة والسلام على من لا نبي بعده ، أما بعد :

### ـــ شوبهەی یەکەم ـــ

هەندێک کەس باسیانکردووە کە ئیمامی بوخاری ( رەحمەتی الله تعالی لێی بێت ) لە ( تاریخ ) ـەکەیدا فەرموویەتی أبو حنیفە زەعیفە و تەرکی حەدیسەکانی بکەن .

بە یارمەتی الله تعالی دەڵێین : بێگومان هەندێک لە شێخە گەورەکانی بوخاری ستایشی أبو حەنیفەیان کردووە ، وە ئەوانیش لە سەردەمی ئەو بوونە و لێیەوە نزیک بوونە ، وە بوخاریش زانایەکی محدث ی مجتهد ی فقیهـ بووە ، ڕاو بۆچوون و اجتهادی هەبووە ، گواستوویەتیەوە لە أبوبەکانی لە کتابە صحیحەکەی ، وە لەهەمان کاتدا أبو حفص الکبیر ی حەنەفی کرد بە قوتابی خۆی کە فقیهی بوخاری بوو ، پاشان بۆ طلبی حدیث دەرچوو لەگەڵ کوڕەکەی أبي حفص الصغیر ، وە کاتێکیش أبو حفص بەمەوە گەڕایەوە بۆ شارەکەی وە بوخاریش هەر بەردەوام بوو لە گەڕانی،

هەتاوەکو الله تعالى بەرزی کردەوە لەوەی کە بەرزی کردەوە لە پلە و پێگەکانی ، وە پێی بەخشی لە فەضل و بەخششی خۆی لەوەی کە پێی بەخشی .

بێگومان هەندێک لەوانەی کە دژایەتی و پەلاماری ئیمامی أبو حەنیفەیان داوە هاورێیەتیەکی نزیکیان هەبووە لەگەڵ ئیمامی بخاری ، وەک ( الحميدي و إسماعيل بن عرعرة بێجگە لەم دووانەش ) ، بۆیە کاریگەر بووە بە قسەی ئەمانەوە ، بۆیە لە تاریخەکەی تۆماری کردووە ئەوەی کە لەم قسە ترسناکانە بیستوویەتی ، محدث و فقيه عبد الرشيد النعماني دەفەرمویێت : لە حافظ زين الدين العراقي گێردراوەتەوە کە ابن أبي حاتم ئەمانەی کۆکردۆتەوە لە کتابی (( أوهام البخاري في التاريخ )) ، السخاوي فەرموویەتی : ابن أبي حاتم جوزئێکی گەورەی داناوە کە تێیدا رەخنەی لە ئیمامی بوخاری گرتووە ، سەیری( ما تمس إليه الحاجة ) بکە ، هەروەها مقدمەی( لامع الدراري على البخاري ) ی الشيخ المحدث محمد زكريا الكاندهلوي و أبو حەنیفە و هاوەڵە محدثەکانی لە وەڵامدانەوەیان لەسەر الحميدى لاپەڕە 275 هاتووە : محمدی کوڕی عبد الله ی کوری الحكم الحميدى لە قسەکانیدا درۆی هەڵبەستووە لەسەر هەندێک لە خەڵکەوە . سەیری( طبقات السبكي ج:1 لاپەڕە:224 ) بکە .

ئیمامی بوخاری لە صەحیەکەیدا ڕیوایەتی لە چەندین غولاتی خەواریجەکان کردووە ، هاوشێوەی عمران بن حطان ئەو کەسەیە کەوا مەدحی بکوژی ئەمیری ئیمانداراانی کردووە عەلی کوڕی ابو طالب ( الله لێی ڕازی بێت ) وە ڕیوایەتی لە هەشتاو یەک

ڕاوی کردووە لە ئەهلی فیرەقە مونحەریفەکان هەروەک ابن حجر لە (( هدي الساري )) وە السيوطي لە (( تدريب الراوي )) ناوەکانیانی باس کردووە ،

( ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە أبو حەنیفە زۆر ئەولاترە لەوەی حەدیثی لێ وەربگیرێ بەڵام ڕەنگە کاریگەر بووبێ بە قسەی هەندێک لە نەیارانی .)!

( بەڵام ئەگەر ووترابێت مورجیئە بووە با بزانین ئەمە چۆن بووە )

ئیمامی بوخاری پێی وایە کە وازهێنەر لە عیبادەتەکان لە ئاخیرەتدا سزا دەدرێت بە ئاگر ، لەکاتێکدا ئیمامی أبو حەنیفە پێی وایە کەوا کەسێک ئەگەر ئیمانی سەلامەت بوو ( واتە لە شیرک ) ئەگەرچی جۆرەها تاوانی سەرپێچی ئەنجام بدات وە بشمرێت بەبێ تەوبە ، ئەوا ئەمرەکەیی لە کۆتاییدا بۆلای الله تعالی یە ، ئەگەر بیەوێت سزای دەدات بە عەدلی خۆی ، وە ئەگەر بشیەوێت لێی خۆش دەبێت بە فەزڵی خۆی ، هەروەک الله تعالی دەفەرموێت :

( إن الله لا يغفر أن يشرك به ويغفر ما دون ذلك لمن يشاء ) .

بۆیە دەبینین کە ئیمامی بوخاری بە أبو حەنیفە دەڵێت : تۆمەتبار کراوە بە ئیرجاء ، جا ئەگەر مەبەستی ئیمام بوخاری پێی ئەوە بێت کە إرجاء بریتی بێت لە إرجاء ی کاری ئیمانداران بۆلای الله تعالی یە دادگایی دەکات چۆنی بوێت ، ئەوا ئەمەش صەحیحە لەبەرئەوەی عەقیدەی ئەهلی سوننە و جەماعەیە ، وە ئەگەر مەبەستیشی پێ ئەوە بێت کە ئەو إرجاء ـەیە واتە ئیمان بەهیچ حاڵێک زیانی پێ ناگات بەهۆی تاوانەوە ( هەروەکو ئەمە ڕای جەهمیەکانە وە ئەوانەشی کە موافقینە ) ئەوا مردود و ڕەت کراوەیە جا هەرکەسێک بیڵێت ، چونکە ژیانی ئیمام ( رحمه الله ) پڕە لە عیبادەت

کردنی بۆ الله تعالی وە ترسان لێی وە زوهد و وەرع و سووربوون لەسەر ڕەزامەنی الله تعالی ، وە لە پەیامەکانیدا تیایدا تۆمار کراوە لە عەقیدەی ئیمام لە الفقه الأكبر و الفقه الأبسط ، ڕەددی ئەو بانگەشەیە ئەداتەوە لەسەر ئیمام وە ڕەفزکردنەوەی قبوڵ کردنی لێی .

الكوثري دەفەرموێت :

لە سەردەمی أبو حەنیفەدا وە لەدوای ئەویشدا کەسانێکی صالح و چاکەکار هەبوون ، باوەڕیان وابوو کە ئیمان قەول و عەمەلە ، زیاد دەکات و کەمیش دەکات ، وە ڕەمی کران بە إرجاء لەلایەن کەسانێکەوە کە پێیان وابوو ، ئیمان : باوەڕ و دەربڕینە ،

الآمدي دەفەرموێت :

موعتەزیلەکان لە سەرەتادا نازناوی مورجیئەیان ئەنا بە کەسانێک کەپێچەوانەیان بوون لە قەدەر .

وە ڕیوایەت کراوە لە عثمان البتي کەوا نوسراوێک هات بۆلای ئیمام أبو حنیفە( رحمه الله ) گوتی : ئێوە مورجیئەن ، ئەویش وەڵامی دایەوە : بەوەی کە مورجیئەکان لەسەر دوو بژاردەن : مورجیئەیەکیان ملعونن وە منیش بەریم لەوان ، وە مورجیئەیەکیش مرحوم ـن وە منیش لەوانم ، وە نووسی کەوا پێغەمبەرانیش لەوانن ، ئایا نەتڕوانیوەتە بۆ ئەو ووتەیەی عیسا علیه السلام

**... وەڵامی گومانەکان لەسەر ئیمامی أبو حەنیفە..............................**

( إن تعذبهم فإنهم عبادك وإن تغفر لهم فإنك أنت العزيز الحكيم )

عبد الشكور السالمي له (( التمهيد )) دەفەرمویت :

لەپاشان مورجیئەکان دوو جۆرن : جۆری یەکەمیان مورجیئەی مرحوم ـن وە ئەوانیش هاوەڵانی پێغەمبەرن ( صلى الله عليه وسلم ) ، وە مورجیئەکەی تریش ملعونن وە ئەوانیش ئەو کەسانەنە کە دەڵێن سەرپێچی هیچ زیانێکی بۆ ئیمان نییە وە سەرپێچی کاریش سزا نادرێت .

الذهبي له (( ميزان الاعتدال ج: 3 لاپەڕە :163 ))

دەفەرموێت : إرجاء مەذهەبی ژمارەیەک لە زانایانە وە نابێت پەلاماری ئەو کەسانە بدرێت کە دەیڵێن ، وە ئەم إرجائەش بە مانای دواخستن دێت ، واتە دواخستنی کاری مرۆڤی ئیماندار بۆلای الله تعالى لە ئاخرەتدا ئەگەر بیەوێت سزای دەدات وە ئەگەر بشیەوێت لێی خۆش دەبێت ، جا ووتەی بوخاری لەم لایەنەوەیە بەڵکو ئەمە لەپێش مەزهەبی هەریەک لەو دووانەوە بووە ، بۆیە مەجالی ڕەددی نییە بەهۆی پێچەوانە کردنی مەزهەبیەوە ، فلكل وجهة هو موليها والله أعلم .

ئیمامی بوخاری رحمه الله لەئاست ئیمامی أبو حەنیفە فەرموویەتی : تەرکی حەدیثەکانی بکەن ، سەرەڕای ئەمەش : ڕیوایەت کراوە لە عباد بن العوام وابن المبارك وهشيم ووكيع ومسلم بن خالد ومعاوية والمقرئ ، پیاوێک بووە کە ڕیوایەتی لێیەوە کراوە لەلایەن ئەمانە و هاوشێوەکانیان ، تیایدا نییە کە بگوترێت ترکی حدیثەکانی بکەن ، وە ئەمەش بە پێویست دانانرێت !!!!!

٭٭... وەڵامی گومانەکان لەسەر ئیمامی أبو حەنیفە............................٭٭

وە لەمەشدا بۆمان ڕوون بوویەوە لە هۆکارەکانی قسە گووتنی بوخاری لەبارەی أبو حەنیفە ( ڕەحمەتی الله لە هەردووکیان بێت ) وە هەندێک لەوانەی لەگەڵیدا بوونە تۆمەتباریان کردووە بە قەولی : پێشخستنی ڕاوبۆچوون لەبەرامبەر نەص پەنا بە الله ( وەڵامی ئەو شوبهەیەش ئەدەینەوە بإذن الله )

وە لەمەشدا دەردەکەوێت کە قسەی بوخاری لەبارەی أبو حەنیفە ڕوویداوە بەهۆکاری خیلافی مەزهەبی نەوەک شتی تر ، وە لەبەرئەمەش باسی زەمەکان ناکات ،

تاج الدین السبکي لە (( قاعدة في الجرح والتعدیل لاپەڕە : 12 وقد أخرجها الشیخ عبد الفتاح أبو غدة في رسالة مستقلة بتحقیقه وعنایته )) دەفەرموێت :

وە پێویستە کەوا بەدوا داچوون بکرێت لەکاتی جەرح کردنی حاڵی کەسێ لە عقائد و اختلافدا بە نسبەت بۆ جەرحکەر و جەرحکراو ، جا ڕەنگە جەرحکراو جەرح کرابێ لەبەرئەوەی لە عەقیدەیدا پێچەوانە هەیە ئەویش لەبەرئەمە جەرحی کردووە ، وە ئاماژەی بە تقي الدین بن دقیق کردووە لە کتابەکەی ( الاقتراح ) کە فەرموویەتی : خاکی موسلمانان چاڵێکە لە چاڵەکانی ئاگر ، دوو کۆمەڵ لە خەڵکی لەسەر لێوەکەی وەستاون ، محدثەکان و فەرمان ڕەواکان .

جا دەڵێم : لەم نموونەی کە لە پێشووترمان باسمان کرد لەووتەی هەندێکیان لە بوخاریدا :

تەرک کردنی بوخاریە لە أبو زرعە و أبو حاتم لەبەر مسئەلەی لەفز .

## ــــ شوبهەی دووەم ــــ

ووتەی ئەو کەسانەی کە لە ( تاريخ بغداد ) هاتووە لە زەمکردنیان بۆ ئیمام أبو حنيفە

ووتراوە کەوا الخطيب البغدادي زۆر ووتەی باسکردووە لە زەمکردنیان بۆ أبو حنيفە بە سەنەد بۆ خاوەن قسەکە .

جا بۆ خستنە ڕووی ئەو شوبهەیەش سەیری کتێبی (( تأنيب الخطيب على ما ساقە في ترجمة أبي حنيفة من الأكاذيب )) بکە جا دەبینیت لەو ئەسانیدانە ڕیوایەتانێکی هەڵبەستراو و ستەم و درۆ و هەڵە و ناتەواوی و جەهل و حەسادەت .

وە بە یارمەتی الله تعالى دەڵێین :

کێشەی زۆربەی موئەلیفە متەقەدیمەکان ئەوەیە کە خەبەرێک باس دەکەن و نەقڵی ئەکەن بە سەنەدەکەیەوە ، جا سەحیح بێت یان سەحیح نەبێت ، وە پێیان وایە کەوا ئەگەر ئەوان تخریجیان کرد بە زامنی ئەوا ناکەونە ناو تاوانەوە ئەگەر باسی سەنەدەکەی بکەن ، بۆیە دەبینین لە تەفسیری الطبري چەندین ئەثەری لاواز هەیە ، بەڵکو چەندین حەدیثی زەعیف هەیە ، وە بەهەمان شێوەش لەم تاریخی بغدادەدا دەبینین چەندین خەبەری غەیر صەحیح و زەعیف هەیە ، وە پێیان وایە کەوا ئەگەر ئەوان باسی ئەسانیدەکان بکەن ئەوا پێویستیان بە حوکم دان نییە بەسەر خەبەرەکە، لەبەرئەوەی " رجال الأسانيد " ناسراون لەلای ئەو کەسانەی کە سەرقاڵن بە عیلمی

رجال ، وە باسکردنی سەنەدەکە دەلالەت ناکات بەسەر صحەتی خەبەرەکە ، جا چەندین فەرموودەی موضوع هەیە هەڵبەسترەوەتە سەر رسول الله ( صلی الله علیه وسلم ) کە سەنەدیشی لە پاڵیەوە هەیە ، وە ڕەنگە تیایدا کۆکرابێتەوە چەندین پیاوی ثقە بە درۆ و هەڵبەستراو .

أحمد بن حجر المكي لە کتێبەکەی (( الخيرات الحسان لاپەڕە : 76 )) دەفەرموێت :

فەصلی سی و نۆ لە وەڵامدانەوەی ئەو ووتانەی الخطيب البغدادي نەقڵی کردووە لە تاریخەکەی لەبارەی زەمکەرەکان لەسەر ئیمام أبو حەنیفە :

بزانە کەوا ئەو ( واتە الخطيب البغدادي ) مەبەستی ئەمانە نەبووە ( لە زەمکردنی أبو حەنیفە ) تەنها کۆکردنەوەی ئەو قسانە نەبێت کە ووتراوە لەبارەی ئەم پیاوە ئەمەش عادەتی هەموو مؤریخ و مێژوو نووسەکانە ، بە بەڵگەی ئەوەی کەوا قسەی ئەو کەسانەی کە مەدحیان کردووە پێشخستووە بەسەر زەمەکان وە زۆر زیاتریشە لەو ، وە لە نەقڵکردنی ئەثەرەکان ، پاشان لەدوای ئەمەوە باسی ووتەی ئەو کەسانەی کردووە کە زەمیان کردووە ،

" عبد الفتاح أبو غدة لە لێدوانێکی لەسەر کتابی (( الرفع والتكميل )) لاپەڕە: 275 دەفەرموێت :

بەڕاستی الخطيب البغدادي طەریقی خۆی لە کتێبەکەی دەربڕیوە ، جا دەفەرموێت : هەرکاتێک لە تاریخ ـدا باسی پیاوێک کرابێت اختلاف و ناکۆکی هەبووە لە قەول و قسەی خەڵکی تیایدا لە جەرح و تعدیل ـدا ..... .أ هـ

جا إعتذار کردن لێی بەوەی کە کەلامی مەدح کارانی پێشخستووە هاوڕا نابێت لەگەڵ دەربڕینەکەی بەوەی پابەندی بووە " .

وە هەروەها لەوەشی کە دەبێتە بەڵگە لەسەر ئەمە ئەو سەنەدانەی کە باسی کردووە لە زەم کردن زۆربەی هەرە زۆری ناچێتەوە سەر قسەکەرەکە یانیش مەجهولە ، جا بە اجماع درووست نییە ناوزڕاندنی مرۆڤێکی موسلمان بەم شێوەیە ، چجای ئیمامێک بێت لە ئیمامی موسلمانان !

وە بە نسبەت صحەتی ئەوەی کە الخطیب باسی کردووە لە زەمکردن لەبارەی قسەکەرەکەی باسی نەکردووە ....

یوسف بن حسن بن أحمد بن عبد الهادي الحنبلي لە کتابەکەی (( تنویر الصحیفة بمناقب الإمام أبي حنیفة / کە مجلدێکی گەورەیە )) دەفەرموێت :

هەڵمەخەڵەتێ بە قسەکانی الخطیب البغدادي ، چونکە دەمارگیریەکی زۆر هەبووە لەسەر کۆمەڵێک لە زانایان ، وەک أبو حەنیفە و أحمد و هەندێک لە هاوەڵەکانیشی ، وە پەلاماریانی داوە بە هەموو ڕوویەکەوە ، وە تیایدا هەندێک لەوانەی کتابیان نووسیوە لە ڕەدانەوەی الخطیب ، وە ئەویش أبو المظفر عیسى بن الملك العادل سیف الدین أبي بکر بن أیوب الحنفي ( 578 / 624 ) وە بێجگە لەویش لە زانایان کتێبیان نوسیوە لەسەر ڕەددانەوەی الخطیب ، لەوانیش إبن الجوزی بەناوی (( السهم المصیب في الرد على الخطیب )) ، وە کوڕەزای إبن الجوزی بەناوی (( الانتصار لإمام أئمة الأمصار )) لە دوو بەرگی گەورەدا ، وە أبو المؤید الخوارزمي لە پێشەکی کتابەکەی (( جامع مسانید الإمام الأعظم )) وە بەهەمان شێوە السیوطي بەناوی (( السهم المصیب في نحر الخطیب )) ، وە محمد زاهد الکوثري بەناوی (( تأنیب الخطیب على ما ساقه في ترجمة أبي حنیفة من الأكاذیب )) وە ئەویش کتێبێکی گەورە کۆکەرەوەیەکی تەواوە " (( السهم المصیب في کبد الخطیب ))

## ـــ شوبهەی سێیەم ـــ

اتهام کردن و تۆمەت بارکردنی بە پێشخستنی قیاس بەسەر نەص :

دەڵێین : بێگومان ئەم شوبهەیە باطلیەکەی زۆر ڕوونە ، چونکە الشعراني بە سەندیەوە بۆ ئیمام أبو حەنیفەوە نەقڵی کردووە کەوا ئیمام فەرموویەتی :

واللە درۆی کردووە و بوهتانی کردووە ئەو کەسەی کە دەڵێت : ئێمە قیاس پێش دەخەین بەسەر نەص ـەوە ! ، ئایا کەس لەدوای نەصەوە پێویستی بەقیاس دەبێت ؟ ، وەهەروەها لێیەوە نەقل کردووە کە فەرموویەتی : ئێمە قیاس ناکەین تەنها لەکاتی زەڕوری و پێویستیەکی زۆر نەبێت ، وە بەم شێوەیەش بێگومان ئێمە بۆ بەڵگەی بابەتێک سەیری قورئان و سوننەت دەکەین یان قەزیەیەکی صەحابە ، جا ئەگەر بەڵگەیەکمان بەدەست نەکەوتبێت ئەوکاتە قیاسمان کردووە ، وە هەروەها لێیەوە باسکراوە کە فەرموویەتی : هەرشتێک لە رسول اللە ( صلی اللە علیه وسلم ) هاتبێت ئەوا لەسەر سەر و لەسەر چاوی خۆمی دائەنێم ، بە دایک و باوکەوە بە فیدای ئەبم هەرگیز مخالفەی ناکەم ، وە ئەوەشی کە لە صەحابەوە هاتووە اختیارم لەپێشەوە و هەڵیدەبژێرم ، وە ئەوەشی لەغیری ئەوان هاتبێ ئەوا ئەوان پیاون و ئێمەش پیاوین .

(( المیزان للشعراني ج: 1 لاپەڕە: 51 وە لاپەڕەکانی دوای ئەویش )) .

٭٭... وەڵامی گومانەکان لەسەر ئیمامی أبو حەنیفە.............................٭٭

لە کتێبی (( الانتقاء )) هاتووە کە أبو حەنیفە فەرموویەتی :

من دەست دەگرم بە کتابی اللە تعالی ،جا ئەگەر لەو بە دەستم نەکەوت ئەوا دەست دەگرم بە سوننەتی رسول اللە ( صلی اللە علیە وسلم ) ، جا ئەگەر بە دەستم نەکەوت لە کتابی اللە و لە سوننەتی رسول اللە ( صلی اللە علیە وسلم ) دەست دەگرم بە ووتەی هاوەڵان ، جا دەست دەگرم بە ووتەی کام لەوان بمەوێت ، وە واز دەهێنم لە ووتەی کەم لەوان بمەوێت ، وە هەرگیز لە ووتەی هاوەڵان دەرناچم لەبەر ووتەی هیچ کەسێکی تر ، جا ئەگەر کارەکە کۆتایی هات ( ئەوە باشە ) یان هاتە سەر ووتەی إبراهیم و الشعبي و ابن سیرین و الحسن و عطاء و سعید بن المسّیب ، ئەوا خۆم اجتهاد دەکەم هەروەکو چۆن ئەوانیش اجتهاد دەکەن .

سەیری (( الانتقاء " لابن عبد البر ومناقب الموفق ج: 1 لاپەڕە: 82 )) بکە .

حەدیثێکی زانرەوە کە إجماعی لەسەرە ، پاشان قیاس دەکرێت مادام قیاسێکی ڕوون هەبێت ، پاشان دەگەڕایەوە بۆ بە چاک دانان ، کامیان چاکتر بووایە دەگەڕایەوە بۆلای ، سەهل دەڵێت : ئەمە عیلمی ابو حەنیفە بووە رحمە اللە کە ئەمنیش عیلمی گشتیە

(( مناقب الموفق ج: 1 لاپەڕە: 89, 90 )) .

**... وەڵامی گومانەکان لەسەر ئیمامی أبو حەنیفە.............................**

وە لە (( مناقب الموفق )) هاتووە بە سەنەدیەوە بۆ الصيمري بە سەنەدیەوە بۆ عبد الله بن يونس ، فەرموویەتی : الحسن بن صالح هەواڵی پێدام و فەرمووی :

أبو حەنیفە زۆر توووند بوو لەسەر لێکۆڵینەوە لە ناسخ ـس حەدیثێک و مەنسوخەکەی ، جا کاری بە حەدیث دەکرد ئەگەر لەلای چەسپابوایە لە پێغەمبەرەوە ( صلى الله عليه وسلم ) ....

وە بەهەمان سەنەدەوە بۆ الصميري گووتی : أخبرنا عمر بن إبراهيم أنبأ مكرم أنبأ أحمد أنبأ علي ابن المديني : گوێم لە عبد الرزاق بوو دەیفەرموو :

لەلای معمر بووم ابن المبارک هات بۆلای جا گوێمان لە معمر بوو دەیفەرموو :

پیاوێک ناناسم کە قسە بکات لە فقهـ و بتوانێت کەوا قیاس بات ، وە دەریبهێنێت لە فیقهـ کە چاکتر بێ لە أبو حەنیفە ، وە بەزەیم نایەتەوە لەسەر کەسێک کە شتێک لە دینی الله چوو بێتە ناویەوە گومانی هەبێت لە أبو حەنیفە .

وە نەقلی کردووە ابن عبد البر بە سەنەدیەوە بۆ محمد بن الحسن فەرموویەتی :

عیلم و زانست لەسەر چوار شێوازانە : ئەوەی کە بە کتابی الله قسە دەکات گومانی تێدا نییە ، وە ئەوەی بە سوننەتی رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) گێڕدراوەتەوە ئەویش گومانی تێدا نییە ، وە ئەوەشی کە اجماعی صەحابەی لەسەرە گومانی تێدا نییە ، وە بەم شێوەیەش ئەوەی اختلاف بن تیایدا ، وە نابێت دەربچێت لەسەر هەموویان ، جا ئەگەر کەوتە هەڵبژاردە لەسەر قەولێک ئەوە زانراوە کە قیاس

**...وەڵامی گومانەکان لەسەر ئیمامی أبو حەنیفە..............................**

دەکەین لەسەری ئەوەی کە گومانی تێدا اییە ، وە ئەوەش کە فقهای موسلمانان بە چاکیان داناوە .... ، جا عیلم لەم چوار ڕووەوە دەرناچێت .

(( السنة ومكانتها في التشريع الإسلام للدكتور مصطفى السباعي لاپەڕە: 38 – وأصول السرخسي ج: 1 لاپەڕە: 318 – وجامع بيان العلم ج: 2 لاپەڕە: 36 )) .

جا دەڵێین ئەمە بە گشتی بەڵگەیە لەسەر مجموعی مصادری فقهی لەلای أبو حەنیفە ، کە ئەویش قورئانی پیرۆزە ، وە سوننەتە بەڕێزەکانە ،وە ئەوەی کە صەحابە اجماعی لەسەرە ، وە لەوەشی کە اختلافیان هەیە لە صەحابەدا ، وە دەرنەچووە لە اقوالەکانیان .

## ـــ شوبهەی چوارەم ـــ

ووتراوە ئیمام أبو حەنیفە قسەی بە ڕاو بۆچوون دەکرد ، وە وتراوە بەڵکو ئەو ئیمامی ئەهلی ڕەئی بووە ، بۆیەش لە زەمکردنی ڕاو بۆچوون نەصێکی زۆر وارید بووە .

لە وەڵامی ئە و شوبهەیەش دەڵێین :

لەکاتی باسکردنی أصولی مەزهەبی ئیمام أبو حەنیفە ئەو چوار أصلە پێشخستراوە لەلای قورئان و سوننەت و اجماعی صەحابە و لەوەشی اختلاف بوونە تێیدا لەپاشان قیاس و اجتهاد و ڕاو بۆجوونی کردووە ، وە دەستگرتنیش بە قیاس و ڕەئی لەلایەن هەر چوار زانای مەزهەبەوە معتبر بووە لەپاش چوار أصلەکە ....

بۆیە ئیمام أبو حنیفە بە ڕاو بۆچوون قسەی نەکردووە وە پەناشی بۆی نەبردووە تەنها کاتێک هیج نەصێک نەبووبێت لە قەزیەیەکدا ،

إبن القیم لە کتابی ( أعلام الموقعین ) دەفەرموێت :

هاوەڵانی أبو حنیفە یەک دەنگ بوونە لەسەر ئەوەی کە مەزهەبی أبو حەنیفە حەدیسێکی زەعیف لەلایان زۆر ئەولاتر و لەپێشترە لە کارکردن بە قیاس و ڕەئی ، وە هەر لەسەر ئەمەش مەزهەبەکەی بینا کردووە ، هەروەکو چۆن حەدیسی پێکەنین لەگەڵ زوعفەکەی کەچی پێشیخستووە بەسەر قیاس و رەئی .....

پاشان ابن القيم باسی چەندین شتی کردووە کە حەدیسی زەعیفیان پێخستووە بەسەر قیاس و ڕەئی ، بۆ زیاتر خوێندنەوەی سەیری (( أعلام الموقعين ج:1 لاپەڕە: 77 ) بکە .

ابن حزم ـیش دەفەرموێت :

هەموو هاوەڵانی أبو حەنیفە یەک دەنگ بوونە لەسەر ئەوەی کە مەزهەبی أبو حەنیفە : حەدیسی زەعیف لەلایان ئەولاترە و لەپێشترە لە قیاس و ڕەئی

(( مخلص إبطال القياس لاپەڕە: 68 )) .

الخطيب البغدادي لە کتێبی (( الفقيه والمتفقه )) باسی کردووە کە :

کیباری صەحابە و بەڕێزەکانیان اجتهادیان کردووە و ڕاو بۆچوونیان هەبووە لە مەسائیلێک کە هیچ نەصێکی لەسەر نییە ، جا لەسەر ئەمەدا لە أبو بكر و عومەر و ابن مسعود و ابن عباس ـەوە نەقلی کردووە ( الله لێیان ڕازی بێت ) ، وە باسی مەسائیلەکانی کردووە کە اجتهادیان تێدا کردووە ، جا أبو حەنیفە یەکەم کەس نەبووە کە قسەی بە ڕاو بۆچوون کردبێ وە نە ئاخیر کەسیش بووە قسەی پێ کردبێ لە شتێک کە نەصی لەسەر نییە .

وە بەم شێوەیەش ڕوون بوویەوە کە دابەزاندنی ئەو ئەثەرانەی کە وارید بووە لە زەم کردنی ( ڕاو بۆچوون بە هەواو ئارەزوو ) لە فقهی فوقەهاکان ، وە بڵاوکردنەوەیان لەڕەددی ئەوان کۆتایی نەهاتووە بە درێژایی مێژوو ...

بەڵام تایبەت کردنی بە حەنەفی بەم ناوە ( ئەهلی ڕەئی ) ئەوە صەحیح نییە و دوورە لە ڕاستیەوە ، وە کۆمەڵەی فوقەهاکان هەموویان ئەگەر اختلاف بوونایە لە شتێک ئەوا دەگەڕانەوە بۆ دلیل ، وە یەکدەنگ بوونە لە دەستگرتن بە قورئان و سوننەت و اجماع و قیاس .

ابن حجر المكي لە (( الخيرات الحسان )) دەفەرموێت :

پێویستە لەسەرت کە لە ئەقوالی زانایان تێبگەیت " واتە متأخیرەکان لە ئەهلی مەزهەبەکەی " لە أبو حەنیفە و هاوەڵەکانی : کە ئەوان کاریان بە ڕەئی کردووە ، وە مەبەستیش پێیان بەمە لێدەرکردنیانە " وە پاڵدانیان نییە بۆ ئەوەی کەئەوان ڕاو بۆچوونیان پێشخستبێت بەسەر سوننەتی رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) وە بەسەر قەولی صەحابە ...

پاشان کە ئەوەی أبو حەنیفە و هاوەڵەکانی لەسەری بوونە لە فقهـ لە دەستگرتن بووە بە قورئان ، پاشان سوننەتی رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) پاشان بە ئەقوالی صەحابە ، وە ڕەددی ئەوانەشیان داوەتەوە کە گومانی بێجگە لەمە دەبەن .

## ـــ شوبهەی پێنجەم ـــ

ووتەی هەندێکیان لەسەر ئەوەی کە أبو حەنیفە دووجار تەوبەی کردووە لە کوفر ...

ووتراوە کە هەندێکیان ڕیوایەتیان کردووە کە ئیمام أبو حەنیفە دوو جاران تەوبەی کردووە لە کوفر ، جا ئەگەر ئەفکارێکی کوفری نەبوو بێت بۆ داوای لێ کراوە کە تەوبە بکات لەم فکرەیە دووجارانیش

فەقیهی محقق علي بن محمد القاري دەفەرموێت : أبو الفضل الكرماني فەرموویەتی :

کاتێک خەوارجەکان لەگەڵ الضحاك هاتنە ناو کوففە ، وە ڕاو بۆچوونیان لەسەر ئەوە بوو کە دەبێت تەکفیری هەموو کەسێکی تاوان بار بکەن وە تەکفیری هەرکەسێکیش بکەن کە کەسێکی تاوانبار تەکفیر ناکات ، جا پێیان گوترا : ئەمە شێخی ئەمانەیە ، جا ئیمامی أبو حەنیفەیان گرت و پێیان گووت : تەوبە بکە لە کوفر ، ئەویش گوتی : من تەوبەکارم لە هەموو کوفرێک ، جا پێیان گووت : ئەو تەوبەی کرد لە کوفرەکانی ئێوە ، دووبارە گرتیانەوە پێیان گوت : ئایا بە عیلمەوە گوتتان یان بە گومان ؟ گوتیان : بە گومانەوە ، ئەوانیش گوتیان : إن بعض الظن إثم ، هەندێک لەم گومانانە تاوانە ، وە إثم یش لە ئایەتەکە تاوانە ، جا دەبێت تەوبە بکەن لە کوفر ، گوتیان :

دەی تۆ دووبارە تەوبە بکە لە کوفر ، ئەویش گوتی من تەوبەم کرد لە هەموو کوفرێک، جا ئا ئەمەیە کە هەندێک کەس دەڵێن : ئیمام دووجاران تەوبەی کردووە لە کوفر ، وە ڕاستیەکە دەپۆشن لەسەر هەموو خەڵکی . ا.هـ

وە گومانی تێدا نییە کە غولاتی خەواریج ئەهلی گومڕایی و لاڕێی ینە ، تەکفیری هاوەڵە بەڕێزەکانیان کردووە ، وە لەناویان ئەمیری ئیمانداران عەلی کوڕی أبي طالب ( الله لێی ڕازی بێت ) ، وە قیتال کردنیان بە حەڵاڵ دائەنا ، وە لەناویشیاندا رسول الله ( صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموێت :

( هەریەکێک لە ئێوە نوێژکردنی خۆی بەکەم دائەنێت لەچاو نوێژکردنی ئەوان و ڕۆژوو گرتنەکەی لەگەڵ ڕۆژی گرتنی ئەوان ، وە قورئان ئەخوێنن بەڵام لە گەروویان ناچێتە خوارەوە ، لە ئیسلام دەرئەچن وەک چۆن تیر لە نێچیر دەرئەچێ.

لەگەڵ ئەمەشدا ئەهلی سوننەو جەماعە بە عام تەکفیریان ناکەن .

جا عیبرەت نییە بە استتابە کردنی ئەوان بۆ موسلمان ، وە نە بە تەکفیرکردنیان بۆی .

## ــ شوبهەی شەشەم ــ

اتهام کردن و تۆمەت بارکردنی بەوەی کە ئیمام فەرموویەتی قورئان مەخلوقە ...

الخطیب البغدادي لە تاریخەکەی (( ج: 13 لاپەڕە: 378, 385 )) گوتوویەتی :

سلمەی کوڕی عەمرٍ لەسەر مینبەر گووتی :

ڕەحمەتی الله لە أبو حەنیفە نەبێت چونکە ئەو یەکەم کەس بوو کە ووتی قورئان مەخلوقە .

الکوثري دەڵێت :

وە منیش دەڵێم وە لە لەفزی ابن عساکر هاتووە لە تاریخەکەی ( ڕەحمەتی الله لە أبو فلاّن نەبێت چونکە ئەو یەکەم کەس بوو کە گووتی قورئان مەخلوقە .

جا لەو خەبەرەی کە باسکراوە لێرەدا گۆڕدراوە لە ( أبو فلاّن ) بۆ أبو حەنیفە ، لەکوێ زانیان کە أبو فلاّن لەم ڕیوایەتەدا أبو حەنیفەیە ، لەگەڵ ئەوەی ڕیوایەتانێکی تر هاتووە لەسەر ئەوەی کە یەکەم کەس هەستا ئەم قسەی گووت جعدی کوڕی درهم بوو ، وە گۆڕینی ووشە بە ووشەیەکی تر لەلای ئەوان زۆر ئاسانە ، وە پێچەوانەکردنی ئەوەی کە یەک لەدوای یەک دێت لەلای أهلی عیلم شتێکە گرنگی پێ نادرێت لە ڕوانگەی ئەوانەوە ...

⋆⋆... وەڵامی گومانەکان لەسەر ئیمامی أبو حەنیفە..............................⋆⋆

ابن أبي حاتم لە کتابی ( الرد على الجهمية ) فەرموویەتی : سعيد بن رحمة فەرموویەتی :

جا کاتێک جەهم لە ساڵی 130 دەرچوو گووتی : قورئان مەخلوقە ، جا کاتێک ئەو قسەیە گەیشتە زانایان ئەم بابەتەیان گەورە کردوو کۆبوونەوە لەسەر ئەوەی کە ئەمە قسە کردنێکی کوفرە ....

وە هەروەها دەفەرموێت :

یەکەم کەس کە هات ووتی قورئان مەخلوقە جعدی کوڕی درهم بوو لە سەرووی ساڵی سەد و بیست ، پاشان جەهمی کوڕی صفوان بوو ، پاشان لەدوای ئەمانەوە بشری کوڕی غیاث بوو .

اللالكائي لە (( شرح السنة )) دەفەرموێت :

خیلاف و ڕاجیاوازی نییە لەنێوان ئومەت کە یەکەم کەس گووتی قورئان مەخلوقە جعدی کوڕی درهم بوو لە سەرووی ساڵی سەد و بیست أ هـ

( وە جەهمیش دەستگیر کرا لە ساڵی 128 ) وە هەر لەو ساڵەش بوو کوژرا لەسەر ئەوەی کە ابن جریر باسی کردووە تەنها اللالكائي نەبێت کە دەڵێت لە ساڵی 132 کوژرا .... .

**...وەڵامی گومانەکان لەسەر ئیمامی أبو حەنیفە...............................**

لەمەدا ڕوون بوویەوە کە یەکەم کەس گوتی قورئان مەخلوقە کێیە ، وە هەموو ئەو ووتانەشی کە نەقل کراوە لەبارەی ئەوەی کە أبو حەنیفە قورئانی بە مەخلوق زانیوە زەعیفە ،

چونکە ئەوەتا ئیمامی أحمد دەفەرموێت :

هیچ ڕیوایەتێکی صەحیحمان نییە کە هاتبێت دەربارەی أبو حەنیفە کە ووتبێتی : قورئان مخلوقە .

وە لە محمدی کوڕی سابق گوتی : پرسیارم لە أبو یوسف کرد گوتم : ئایا أبو حەنیفە ووتویەتی: قورئان مەخلوقە ؟ ئەویش فەرمووی : پەنا بە الله ، وە هەروەها منیش وانالێیم .

## ـــ شوبهەی حەوتەم ـــ

اتهام کردن و تۆمەت بار کردنی بەوەی کە أبو حەنیفە فەرموویەتی بەهەشت و دۆزەخ کاتیە و نامێنن

البغدادي لە تاریخەکەی ڕیوایەتی کردووە :

الحسن بن علي الجوهري ، حدثنا محمد بن العباس الخزاز ، حدثنا محمد بن القاسم البزاز ، حدثنا عبد الله بن أبي سعد ، قال حدثني أبو عبد الرحمن عبد الخالق بن منصور النيسابوري ، قال : سمعت أبا داود المصاحفي قال : سمعت أبا مذيع يقول :

( أبو حەنیفە گووتی : بەهەشت و ئاگر دوو مەخلوقن جا هەردووکیشیان لەناو دەچن. )

اخبرنا محمد بن الحسين بن الفضل ، حدثنا علي بن إبراهيم النجاد ، حدثنا علي بن إبراهيم النجاد ، حدثنا محمد بن إسحاق السراج ، قال سمعت إبراهيم بن أبي طالب يقول : سمعت عبد الله بن عثمان بن الرماح يقول ، سمعت أبا مطيع البلخي يقول :

( گوێم لە أبو حەنیفە بوو دەیگوت : ئەگەر بەهەشت و دۆزەخ دوو درووست کراو بووبن ئەوا هەردووکیان لەناو دەچن و نامێنن ، أبو مطيع گووتی : والله درۆی دەکات ، السراج یش گووتی : والله درۆی دەکات ، النجاد یش گووتی : والله درۆی دەکات ، چونکە الله تعالى دەفەرموێت : (( أكلها دائم )) واتە : ( خواردنەوەی بەهەشت هەمیشەییە و بەردەوامە ) ، ابن الفضل گووتی : والله درۆی دەکات .

دەڵێم ( واتە : بغدادی دەڵێت ) : ئەم ووتەیە أبو مطيع کە نەقڵ کراوە نەوەک أبو حەنیفە هەموو ئەوانەی گێڕاویانەوە ووتویانە والله درۆی دەکات .

الكوثري دەفەرموێت :

دەڵێم : أبو داود المصحافي سلیمانی کوڕی سلیم ـە بانگخوێنی مزگەوتی بلخ ـە ، محمد بن جعفر الورّاق باسی کردووە لە ( طبقات علماء بلخ ) هەروەکو چۆن لە کتێبی ( أنساب ) ی السمعانی هاتووە ، کە لە سەنەدی خەبەری یەکەم الخزاز ، وە لە دووەم إبن الرماح ، صەحیح نین لەگەڵ بوونی هەردووکیان لە دوو سەنەدەکە ....

وە لەبەر پێچەوانە کردنی دوو خەبەر کە لە أبو حەنیفەوە هاتووە لە (( الفقه الأبسط )) بە سەنەدەوە دەفەرموێت :

( جا ئەگەر ووترا بەهەشت و ئاگر لەناو دەچن ئەوا تۆش پێی بڵێ الله وەصفی نەعیم و خۆشیە نەبڕاوەکەی کردووە بەم ووتەیەی کە دەفەرموێت : (( لا مقطوعة ولا ممنوعة )) واتە بەروو بوومی بەهەشت نە تەواو دەبێت نە قەدەغە کراویشە ، وە

هەرکەسێک ووتی لەناو دەچن لەدوای چوونی ئەهلکەی بۆ ئەو دووانە ئەوا کافر بووە بە الله تعالی چونکە ئینکاری هەمیشەیی ئەو دووانەی کردووە )

وە لە (( الفقه الأكبر )) هاتووە ، ڕیوایەت کراوە لە علي بن أحمد الفارسي عن نصر بن يحيى عن أبي مقاتل عن عصام بن يوسف عن حماد بن أبي حنيفة عن أبي :

( بەهەشت و دۆزەخ دوو مەخلوق و درووست کراون لە ئێستادا هەرگیز لەناو ناچن )

وسنده في أول النسخة الخطية المحفوظة ضمن المجموعة (( رقم 226 )) بمكتبة شيخ الإسلام بالمدينة المنورة . أهـ (( من ص: 107 , 109 وانظر مقدمة الكوثري في التأنيب )) .

وە لە کۆتایی دەڵێم زۆر شوبهەی ترم ئامادە کردبوو و کۆمکردبوویەوە نزیکی20 ڕەددم ئامادە کردبوو وە زۆر بەدرێژی ، من لەهەر شوبهەیەک تەواو کورتم کردبوویەوە ، بەڵام لە ئێستادا ڕایدەگرم گەر الله بۆی ئاسان کردم لەکاتێکی تر تەواویان دەکەم ان شاء الله ،

ئەمەش بەبیر براکانم دەخەمەوە چونکە مرۆڤی عاقڵ یەک ووشەی بەسە( أعدوا للسؤال جوابا ) ،

هەرهیچ نەبێ براکەم توقف بکە ، مادام خیلاف هەبێ لەسەر تەکفیر کردنی تۆ تەوقف بکە ، یعنی تۆ پێت وایە هەزاران ساڵە موسلمانان تووشی گومڕایی بوون چونکە تەکفیری ئەویان نەکردووە ، ابن تیمیە دەڵێ اتفاق هەیە لەسەر ئیمامەتی ابو حەنیفە ، بۆیە دڵنیات ئەکەمەوە لەوەی ئومەت هەرگیز لەسەر گومڕایی کۆنابێتەوە، بۆیە سەیری عولەمای کیباری ئەو سەردەم بکە بزانە چی لەبارەی ئەو دەفەرموون نەوەک بە قیل و قال تەکفیری کەسێک بکەی أصلی نەبێت ، لەکۆتاییدا الحافظ محمد کوڕی یوسف الصالحي الشافعي خاوەنی ( السیرة الشامیة ) لە کتێبی (( عقود الجمان )) دەفەرموێت : بزانە ( رەحمەتی الله لەخۆم و ئێوەش بێت ) کە ئەوانەی الخطیب ڕیوایەتی کردوون لە زەمکردنیان بۆ ئیمام أبو حەنیفە زۆربەی هەرە زۆری سەنەدەکانیان ناجێتەوە سەر خاوەن قسەکە یانیش مجهولی تێدایە ، بۆیە هەرگیز درووست نییە بۆ ئیماندارێک کە ئیمان دەهێنێت بە الله و ڕۆژی قیامەت ئاوا عەرزی موسلمانێک هەتک بکات بەم شێوەیە چجای ئیمامێک بێت لە ئیمامی موسلمانان .

والسلام علیکم ورحمة الله وبرکاته

